

# ڕوکن و مەرجەکانی

# لا إله إلا الله

## لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە



# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : ڕوکن و مەرجەکانی لااله الا اللّٰه

ئامادەکردن : عبداللّٰه تەوحیدی

ژمارەی لاپەڕە : 44



# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْـــد للهِ، نَحْمَـــدُهُ وَنَسْــتَعِينُهُ وَنَسْــتَغْفِرُهُ، وَنَعُــوذُ بِاللهِ مِــنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا وَمِـنْ سَـيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْـدِهِ اللهُ فَـلا مُضِـلَّ لَهُ، وَمَــنْ يَضْــلُلُ فَــلَا هَــادِيَ لَهُ، وَأَشْــهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْــدُهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدَاً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ،

سەرەتا سوپاس و ستایشی بەردەوام و بێکۆتا بۆ الله تعالی کە ڕێنمونی کردم و یارمەتی دام بۆ ئامادەکردنی ئەم نامیلکە بچووکە بۆ خزمەت موسڵمان.داواکارم لە الله تعالی لەپێناو خۆی لێمان قبوڵ بکان . ئەم نامیلکەیە باسی گەورترین و بەڕێزترین وشـــە دەکات کە لە پێناوی دا ئاســـمانەکان و زەویەکان دروســـت کراون ، وە هەموو مرۆڤ و پەریەکان لە پێناوی ئەوە وشە گەورەیە دروست کـــراون ،وە هەر لەسەر دەمی پێغەمبەر نوح ـــەوە علیه السـلام تاوەکو محمد علیه الصلاة والسـلام پێغەمبەران علیهم السـلام نێردراون بۆ گەیاندن و ڕوونکردنەوەی ئەم وشـــە گەورە و بەڕێزە وە لە هەموو کتێبە ئاســمانیەکاندا باسی لێوە کراوە ، وە هەر ئەم وشـــەیە جیاوازی دەخاتە نیوان موســڵمانان و کافران . جا بۆیە وەشەیێکی هێندە گەورە و بەڕێز بەڕاستی جێگای خۆیەتی کە موسڵمانان بزانن چیە و چ گەوەرێیکی هەیە ، وە ماف و پێویســـتیەکانی چیە و دەبێت چی ئەنجام بدەیت بۆ ئەوەی الله تعالی ئەو وشـەیەت لێ قبوڵ بکات ، وە بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئەمڕۆ کە

پرییەتی لە فیتنە و تاقیکردنەوە ، وە زۆرێک لەوانەی کە خۆیان بەبانگخواز دەزانێت و دینی ئیسلام بە خەڵکی ڕادەگەیێنێت بەڵام هیچ کات ئەم وشەیە بۆ خەڵکی باسناکەن و ماف و حەقەکانی بەخەڵکی ناڵێن تاوەکو خەڵکی جێبەجێی بکەن وە زۆر جاریش خۆشیان جێبەجێی ناکەن و حەق و مافەکانی نادەن ، هەر بۆیە هەڵساوین بە باسکردنی حەق و مافەکانی و پێویستەیکانی ئەم وشە گەورەیە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەکات ، جادواکارم لە الله تعالی ئێمە و تێکڕای موسڵمانان بەرچاو ڕۆشن بکات بۆ دینی خۆی و لەسەر ئیسلام و ئیمان بمان مرێتنێت و زیندوومان بکاتەوە

آمـــــین

# «مانای لااله الا الله»

وشـــەی . لااله الاالله واتا : لا معبود حق إلا الله، واتا هیچ پەرســـتراوێک نێە بەحق بۆ پەرســـتن تەنها الله تعالی نەبێت .وەک الله تعالی دەفەرموێت : «ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَـٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ»[1]واتا : ئەو بیســتن و ببینینەش بە هۆی ئەوەیە چونکە بەڕاســتی الله تعالی خۆی حەق و ڕاســتە، ئەوانەش کە ئەوان هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو هەر ئەوە خۆی باتاڵ و ناحەقیە. بێگومان ئەو الله ـــیە بڵندو بەرزو مەزن و گەورەیە .»لێرە دا – بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ

١ [سورة الحج:62 | تەفسیری ئاسان]

ٱلْحَقُّ – واتا : تەنها  الله تعالی حەقە بۆ پەرستن و شیاوی پەرستنە . کە ئەمەش دان پێدانانە بۆ شایستەیەتی  الله تعالی  بۆ پەرستن . وە بەشەکەی کۆتای کە دەفەرموویێت – وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَـٰطِلُ – واتا : وە ئەوەنەی کە خەڵکی داویان لێدەکەن لە غیری  الله تعالی وە دەیپەرستن ، ئەوا ئەو پەرستراوانە باطل و پوچن و حەق و ڕەوانین بۆ پەرستن . بەڵکو هەر  الله تعالی ـیە کە حەق و  شیاوە بۆ پەرستن ،وە  الله تعالی لەسەر زمانی چەندین لە پێغەمبەران (علیهم السلام) پێمان ڕادەگەیەنێت کە بڕوامان وابێت بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بۆ پەرستن بەحەق تەنها  الله ی بەرزو خاون شکۆ نەبێت کە پێغەمبەران فەرموویانە «يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ»[2]واتا : ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر  الله  بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نیە ،»ئەو بەشەی کە دەفەرموێت – يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ – ئەوە دانپێدانان  و جێگرکردنی شایستەیەتی و شیاوی الله تعالی بۆ پەرستن ، وە بەشەکەی تریشی کە دەفەرموێت – مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ – ئەمەش ڕەتکردنەوە و بە ناڕاست زانینی ئەو پەرستراوانەیە کە لە غەیری  الله تعالی دەپەرسترێن و عیبادەتیان بۆ دەکرێت و گوێڕایەڵی تەواویان بۆ دەکرێت لە قدەغەکردن و فەرمان پێکردن .وە ئەو پێغەمبەرانەش  ئامانەن | نوح – هود – صالح – شوعەیب | علیهم السلام | .

وە بزانە  الله ڕەحمت لێ بکات لاإله إلاالله وشەیێکی ئاسایی نیە کە هەر کەس وتی ، ئەوا لێی قبوڵ بکرێت و بە ئەهلی ئەو وشەیە حساب بکرێت و دان بنرێت ، بەڵکو

---

٢ [سورة الأعراف:59 | تەفسیری ئاسان]

ئەو وشەیە شتی زۆر لە خۆی دەگرێت ، وە ڕوکن و مەرجی هەیە ،وەک لە فەرموودەی معاذ هاتوە (الله لێی ڕازیبێت) کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووە: «إذا سألك أهل اليمن عن مفتاح الجنة فقل: لا إله إلا الله»[3]واتا : ئەگەر خەڵکی یەمەن پرسیاریان لێ کردیت سەبارەت بە کلیلی دەرگای بەهەشت ، ئەوە پێیان بڵێ کە لااله الا الله کلیلی دەرگای بەهەشتە .»لە ئیمامی بخاری ـەوە رحمەالله ئەویش لە دەگێرێتەوە کە پرسیار لە وهبی کوری منبە کرا: «أليس مفتاح الجنة لا إله إلا الله؟ قال: بلى ولكن ليس من مفتاح إلا له أسنان فإن أتيت بمفتاح له أسنان فتح لك وإلا لم يفتح»[4] واتا : ئایە کلیلی دەرگای بەهەشت لااله الاالله نیە ؟. فەرمووی :بەڵێ بەڵام هیچ کلیلێک نیە ئیلا ددانی هەیە ، وە گەر هاتوو کەلیلێک ددانی هەبوو ئەوە دەرگاکەت بۆ داکاتەوە گەر دادانی نەبوو ئەوا دەرگاکەت بۆ نایکاتەوە .ددانەکانی ئەو کلیلە کە وشەی لااله الا الله ـیە ئەوە ڕکن و مەرجەکانیەتی ، وەک لە زۆر فەرموودەی تریش هاتوە کە باس لەوە دەکات لااله الاالله هۆکارە بۆ ئەوای خاوەنەکەی بخاتە بەهەشتەوە ، وە لەگەڵ ئەو چونە بەهەشتەوە چەندین مەرج دانرداوە بۆ خاوەنەکەی چونکە بەبێ ئەو مەرجانە ئەو وشەیە کە لااله الاالله قبوڵکراو نیە و وەر ناگیرێت.

## «ڕوکنەکانی لااله الا الله»

٣ [احمد | 242/5]

٤ [رواه البخاري معلقاً قبل حديث (1237)، ووصله أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (66/4). وانظر: ((تغليق التعليق)) لابن حجر (453/2-454)]

ڕوکن ـەکانی لااله الاالله : بریتین لە دوو ڕوکن ئەوانیش بەناوی [النفی] و [الإثبات] هەر کەسێک موسڵمان بێت یان کافر بێت بیەوێت ببێت بە موسڵمان ئەوا دەبێت ئەم دوو ڕوکن ـە جێبەجێ بکات و کاریان پێ بکات بەدڵ و وتە و کردار وە هەر کەسێکیش هەر کام لەم دوو ڕوکن ـەی جێبەجێ نەکرد گەر موسڵمان بێت ئەوا کافر دەبێت ، وە گەر کافریش بێت ئەوا بەو شێوەیە موسڵمان نابێت تاوەکو هەردوو ڕوکن ـەکان جێبەجی نەکات و کاریان پێ نەکات ، وە هەر کەسێک ئەم وشەیە بڵێت و کاری پێبکات و بڕوای پێی هەبێت ئەوە سەرفرازی دونیا و قیامەت دەبێت وەک لە فەرموودەی طاریق ی کوڕی عبدالله ی هاتووە کە پێغەمبەری ﷺ بینیوە لە بازاری ذی المجاز کە بەدەنگی بەرز بانگی لە خەڵکی کردوە و فەرموویەتی : «یا أيُّها الناسُ قولوا لا إلهَ إلَّا اللهُ تُفلحوا، ..»[5]واتا ; ئەی خەڵکینە بڵێن هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحق تەنها الله تعالی نەبێت ،تا سەر فراز ببن ..»[النفی] و [الإثبات] لە وشەی لااله الاالله لەم دوو جێگایەن ، النفی بریتیە لەو -لا- مەی کە لە سەرەتای وشەی لااله الا الله دا هاتوە کە بە مانای ڕەتکردنەوە دێت وە لەم ڕستەیەش دا بریتیە لە نەفی کردنی -اله- کە بەمانای پەرستراو دێت ، کەگەر ئەم دوو وشەیە لێک بدەین دەبێت بە -لا اله- واتا : هیچ پەرستراوێک نیە بۆ پەرستن شایەنی پەرستن بێت بەحەق ، وە الإثبات بریتیە لەو -الا- یەی کە لە پێش وشەی -الله- هاتووە کە بەمانای جێگرکردن و دانپێدانان دێت بۆ وشەکەی کە لە دوای خۆی دا هاتووە کە وشەی -الله- کە ئەگەر ئەم دوو وشەیە لێک بدەین دەبێت بە الاالله کە بەمانی ئەوە دێت تەنها الله ، وە ئەگەر

٥ [ابن حزم | المصدر : المحلی – الرقم: 112/9]

هەموو ئەم وشانە لێک بدەین دەبێت بە لااله الاالله کە بەواتای ئەوە دێت هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله نەبێت یان ئیلا الله نەبێت .جا هەر کەسێک نەفی پەرستراوەکان نەکات ،وە لەگەڵ ئەوشدا ئیمانی هێنابێت بە الله تعالی ، ئەوە موشریکە وەک چۆن موشریکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دانایان بە وجودی الله تعالی دادەنا بۆ عیبادەت بەڵام نەفی پەرستراوە باطڵ و پوچەکانیان نەدەکرد . وە بەو حاڵەشەوە موشریک بون ، وە ئەو کەسەی اثباتی شایستەیتی الله تعالی نەکات بۆ پەرستن ئەوە کافرە وەک مولحید و بێدینەکان ،

با بـــزانین لە قورئـــانی پـــیرۆزدا چشـــتێک بە پەرســـتراو دانـــدراوە و ناو هێـنرداوە و چەنـد جـۆر پەرسـتراو باس کـراوە، لەقوئانـدا چـوار جـۆر باسـکراوە ، ئەوانـیش بـریتین لە ئەم چـوارد دانەیە – الهـة – انـداد – ارباب – الطـاغوت – بەڵـگە لەسـەر هەبـوونی – الهـة - .الله تعـالی لەسـەر زاری پێغەمـبەر ابـراهیم علـیە السـلام دەفەرموێـت : «أَئِفْـكًا آلِهَـةً دُونَ اللَّهِ تُرِيـدُونَ»[6] واتا : ئـایا شـتی دەسـت هەڵبەتـە دەکەنـە خـواو لە جیـاتی الله تعـالی دەتانـەوێت بیپەرستن؟!~دەسـت هەڵبەستە واتا ئەوە شتـەی کـــــــــە بەدەســــــت دورســـــتکراوە.

الهـة واتا : ئەوشـــتەی کە بپەرسرێـت لە پێنـاو سـود گەیانـدن و زیان لاردن . بەڵـگە لەسـەر ئەوەی کە مـوشرینکان الهـة دەپەرسـتن بـۆ سـود گەیانـدن وتەی الله تعـالی ـیە وەک دەفەرموێـت : «وَٱتَّخَـذُواْ مِـن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَـةً لِّيَكُونُـواْ لَهُـمْ عِـزًّا»[7]

---

٦ [سورة الصافات:86|تەفسیری ئاسان]

٧ [سورة مريم:81|تەفسیری ئاسان]

واتا : ئـەو بێ باوەڕانـە لەجیـاتی  الله  جۆرەهـا شـتی تـریان کردۆتـە خـوای خـۆیان تا پایـەداری و دەسـەڵاتیان (بەخـەیاڵی خـۆیان) دەسـت بکـەوێت.»ئەمە بەڵـگەیە کە مـوشریکان بە مەبەسـتی ئەوە الهـة دەپەرسـتن تا پـایەداری و دەسـەڵاتیان پێبـدات ، وە ئەمەش بـۆ سـود گەیانـدنە ، وە بەڵـگەش لەسـەر ئەوەی کە مـوشریکان بـۆ زیان لابـدن الهةـەکان دەپەرسـتن ، وتەی  الله تعـالی یە وەک دەفەرموێـت : «أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَـا..»[8] واتا : یان ئـەو بێباوەڕانـە چەنـد خوایەکیان هەیـە کـە دەتـوانن لە سزامـان ڕزگـاریان بـکات جگـە لە ئێمـە .؟ ... »ئەمە بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی مـوشریکان بـۆ ئەوە الهـة ـەکان دەپەرسـتن تا لە سزای  الله تعـالی یان  لـێ لابـدەن . -الهـة- جەمعـی -اله- کە بەواتای پەرسـتراوا دێـت وە  الله تعـالی نەهـی کـردوە  لە پەرسـتنی -اله- وەک دەفەرموێـت : «لَقَـدْ أَرْسَـلْنَا نُوحًـا إِلَىٰ قَوْمِـهِۦ فَقَـالَ يَٰقَـوْمِ ٱعْبُـدُواْ ٱللَّهَ مَـا لَـكُم مِّـنْ إِلَٰهٍ غَـيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَـافُ عَلَـيْكُمْ عَـذَابَ يَـوْمٍ عَظِـيمٍ»[9] واتا : سـوێند بـە  الله  بەڕاسـتی ئێمـە - نـوح – مـان ڕەوانـە کرد بۆ سـەر قەومەکـەی، جا ئـەویش پێـی وتـن: ئـەی گـــەل و هـــــۆزم ئێـوە هـەر الله  بپەرسـتن، چونکـە جگـە لەو زاتـە خوایـەکی تـرتان نیـە، بەڕاسـتی مـن دەتـرسم لەرۆژێکـی گـەورەدا تـووشی بـەڵاو سزایـەکی زۆر سـەخت بـبن»  وە ئەمە بەڵـگەیە کە  الله تعـالی نەهـی کـــردوە لەوەی -اله- یێـــک لە غەیـــری خـــۆی بپەرســـترێت . وەک دەفەرموێـت  پێغەمـبەر نـوح ـمان علـیە السـلام  ناردوە بـۆ ئەوەی بەخەڵکـی بڵێـت

---

٨  [سورة الأنبياء:43|تەفسیری ئاسان]

٩  [سورة الأعراف:59|تەفسیری ئاسان]

که تەنها اللەتعالى بپەرستن ، چونکە لە غەیری ئەو پەرستراوە هیچ شتێکی تر نیە کە بیپەرستن .

بەڵگە لەسەر هەبوونی -انداد- الله تعالی دەفەرموێت : «قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ»[10] واتا : ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: باشە ئاخر ئێوە باوەڕتان بەو زاتە نیە کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروست کردووە؟ (ئاڵبەتە ئەو ڕۆژانە مەگەر الله خۆی بزانێت درێژی ماوەکەیان چاندە)، چەند هاوەڵێکیشی بۆ بڕیار دەدەن؟! ئەو بەدیهێنەر و دروستکارە پەروەردگاری هەر هەموو جیهانیان و بوونەوەرە.» -انداد- واتا : ئەوشتەی کە مەیلی دڵی بەلا دادەچێت بۆ پەرستن و خۆشەویستنێکی زیاد لەحەد . بەڵگە وتەی الله تعالی یە کە دەفەرموێت : «وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ..»[11] واتا : (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی الله پەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویەکانی الله ناکەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران الله یان خۆش دەوێت،.. »ئەمە بەڵگەیە

١٠ [سورة فصلت:9|تەفسیری ئاسان]
١١ [سورة البقرة:165|تەفسیری ئاسان]

لەســەر ئەوەی کە مــوشریکان -انــداد- ـەکانیــان هاوشــێوەی خــۆش ویســتنی الله خــۆش دەوێــت وە لە جیــاتی الله تعــالی دەیان پەرســتن .وە الله تعــالی ڕێگــری کــردوە و نەهــی کــردوە لەوەی کە انــداد بپەرســترێت لە جیــاتی بەتاک پەرســتنی الله تعــالی لە هەمــوو عیبادەتەکانــدا وەک الله ــی بەرز و شــکۆ دار دەفەرموێــت : «ٱلَّذِی جَعَـلَ لَـكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَ ٰشࣰـا وَٱلسَّمَاۤءَ بِنَـاۤءࣰ وَأَنـزَلَ مِـنَ ٱلسَّـمَاۤءِ مَـاۤءࣰ فَـأَخۡرَجَ بِـهِۦ مِـنَ ٱلثَّمَـرَ ٰتِ رِزۡقࣰـا لَّـكُمۡۖ فَـلَا تَجۡعَلُـوا۟ لِلَّهِ أَنـدَادࣰا وَأَنـتُمۡ تَعۡلَمُـونَ»[12] واتا : هــەر ئەوزاتــە زەوی کــردووە بــە فــەرش و جێگــای نیشــتەجێ بــوون و ژیان بــۆتان، ئاســمانی وەکــو ســەقفێك بەســەرتانەوە ڕاگــیر کــردووە، لە ئاســمانەوە ئــاوی بــۆ بارانــدوون، جــا بەهۆیــەوە جۆرەهــا بەرهــەمی (درەخــت و گژوگیــای) بــەدەرهێناوە تا ببێتــە ڕزق و ڕۆزی بــۆتان، کەواتــە شــەریك و هــاوتا بــۆ الله بــڕیار مــەدەن، کــە خۆشــتان دەزانــن پەرســتراو دەبێــت بەدیهێنــەر بێــت. »وە ئەمە بەڵــگەی ڕۆنە کە الله تعــالی نەهــی دەکات و دەفەرموێــت : «فَـلَا تَجۡعَلُـوا۟ لِلَّهِ أَنـدَادࣰا = کەواتــە شــەریك و هــاوتا بــۆ الله بــڕیار مــەدەن» بــۆیە نابێــت بە هــیچ جورێــک مــرۆڤەکان و پەریـیەکان انـداد بـۆ الله تعـالی بـڕیار بـدەن و لەجیـاتی الله تعـالی بیـان پەرسـتن و عیبادەتیان بۆ ئەنجام بدەن .

بەڵــگە لەســەر هەبــوونی -ارباب- الله تعــالی لەســەر زمــانی پێغەمــبەر یوسـف علـیه السـلام پـێمان دەفەرموێـت : «یَـٰصَـٰحِبَیِ ٱلسِّـجۡنِ ءَأَرۡبَابࣱ مُّتَفَرِّقُـونَ

---

١٢ [سورة البقرة:22]تەفسیری ئاسان]

خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ»[13] واتا : (ئەوسا ڕووی تێکردن وتی): ئەی هاوەڵانی زیندانم، ئایا چەند خوایەکی هەمە جۆر و جیاوازی (بپەرسترێن)چاکترن، یاخود خوایەکی تاك و تەنها و زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا؟»

ارباب واتا : ئەوشتەیە کە خەڵکی دادوەری بۆ لا دەگێرنەوە و ئەویش حوکمیان دەکات و یان یاساکانیا لێ دەگوڕێت و یاسای تازەیان بۆ دادەڕێژێت ، وە الله تعالی پێیان ڕادەگەینێت کە موشریکان عالیم و عابیدەکانیان دەکرد بە -ارباب- لە غەیری الله تعالی، وەک الله تعالی دەفەرموێت : «ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ...»[14] واتا : (گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی الله (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن) ..» ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موشریکان گەورە و سەرانی خۆیان دەکرد بە حاکم و یاسا دانەر بەسەر خۆیانەوە ، و الله تعالی نەهی کردوە و ڕێگری کردوە لەوەی کە مروڤ و پەریەکان کەسان و شتی تر بکەن بە -ارباب- بەسەر خۆیانەوە جگەلە الله تعالی ، وەک الله خاوەن شکۆ و ڕێزدار دەفەرموێت : «وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًا أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ»[15] واتا : (هیچ پێغەمبەرێک) فرمانی ئەوەی نەداوە

---

١٣ [سورة يوسف:39|تەفسیری ئاسان]
١٤ [سورة التوبة:31|تەفسیری ئاسان]
١٥ [سورة آل عمران:80|تەفسیری ئاسان]

کــە فریشـــتەکان و پێغەمبـــەران بکـــەن بـــە پـــەروەردگار (هـــەرگیز کاری لەو جـــۆرە لەوان ناوەشـــێتەوە) ئـــایا ڕاســـتە فرمـــانی بێ باوەڕیی و کـــوفرتان پـــێ بـــدات دوای ئـــەوەی کـــە ئێـــوە موســـڵمانن و ملکـــەچی پـــەروەردگارن؟!»  وە ئەم بەڵـــگەیە لە ڕونتریـــنی بەڵـــگەکانە کە  الله تاک و تەنهـــا فەرمـــانی بە هـــیچ پێغەمبەرێـــک نەکـــردوە کە بەخەڵکـــی بڵـــێن پێغەمـــبەران و مەلائـــیکە بەکەن بە حـــاکم و دادوەر لە نێـــوان خـــۆتان و فەرمانتـــان پـــێ بـــکەن بە کـــوفر کـــردن لەوەی ئەوەی کە فەرمـــانی پێتـــان کـــردوە بە موســـڵمان بـــوون . بەڵکـــوو  الله تعـــالی نەهـــی کـــردوە  لەوەی کە  کەســـێک لە غەیـــری خـــۆی بکرێـــت بە دادوەر و حـــاکم وەک دەفەرموێـــت : «..إِنِ ٱلْحُـــكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَـــرَ أَلَّا تَعْبُـــدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ..»[16]   واتا : ..بەڕاســـتی حـــوکم و فـــەرمانڕەوایی جگـــە لە الله  شایســـتەی کـــەسی تـــر نی یـــە، فەرمانیشـــی داوە جگـــە لە خـــۆی کـــەسی تـــر نەپەرستن، ..

بەڵـــگە لەســـەر هەبـــونی – الطـــاغوت -  الله تعـــالی دەفەرموێـــت : «أَلَـــمْ تَـــرَ إِلَى ٱلَّذِيـــنَ أُوتُـــواْ نَصِـــيبًا مِّـــنَ ٱلْكِتَـــٰبِ يُؤْمِنُـــونَ بِٱلْجِبْـــتِ وَٱلطَّـٰغُـــوتِ وَيَقُولُـــونَ لِلَّذِيـــنَ كَفَـــرُواْ هَـٰٓـــؤُلَآءِ أَهْـــدَىٰ مِـــنَ ٱلَّذِيـــنَ ءَامَنُـــواْ سَـــبِيلًا»[17]   واتا : ئـــایا نەتڕوانیوەتـــە ئەوانـــەی کـــە بەشـــێک لە کتێـــبی ئاســـمانی پێـــدراوە (کـــەچی لەگـــەڵ ئەوەشـــدا) باوەڕیان بـــەفاڵچی و جادووگـــەرو بـــت و پەیکـــەرو شـــەیتان و ... هەیـــە و دەربارەی ئەوانـــەی کـــە بێ

١٦  [سورة يوسف:40|تەفسیری ئاسان]
١٧  [سورة النساء:51|تەفسیری ئاسان]

باوەڕن دەڵـێن: ئەوانـە چـاکترن و ڕێـازی ڕاسـتتریان گرتـووە، تا ئەوانـەی کـە ئیمان و باوەڕیان (بـەئاینی ئیسـلام هێنـاوە)..» الطـاغوت واتا : ئەوشـتەی کە سـنوری بەنـدایەتی بەزانـدوە بـۆ سـنوری خـوایەتی جـاگەر ئەو خـوایەتییە لە گـوێڕایەڵی بێـت کە هاوشـــێوەی الله گـــوێڕایەڵی بکرێـــت ، یان لە پەرســـتن دابێـــت کە هاوشـێوەی الله بپەرسـتریێت ، یان لە شـوێن کەوتـن بـدایێت وەک چـۆن خەڵکـــی شـــوێن بەرنامەی الله دەکەوێـــت . وەک الله تعـــالی لە بارەی گـوێڕایەڵی مـوشریکان بـۆ الطـاغوت دەفەرموێـت : «أَلَـمْ تَـرَ إِلَى ٱلَّذِيـنَ يَزْعُمُـونَ أَنَّهُـمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنـزِلَ إِلَيْـكَ وَمَآ أُنـزِلَ مِـن قَـبْلِكَ يُرِيـدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُـوت ..»[18] واتا : ئـایا نەتڕوانیووەتـە ئـەو (دووڕووانـەی) لافی ئـەوە لـێ دەدەن گوایـە بەڕاسـتی باوەڕیان هێنـاوە بـەوەی کـە بـۆ تـۆ ڕەوانـەکراوە و بـەوەش کـە پـێش تـۆ ڕەوانـەکراوە (بـۆ پێغەمبـەران)! کـەچی دەیانـەوێت ڕووبکەنـە زۆردارو جادووگـەرو خوانەناسـان تا دادوەریان لە نێوانـــدا بکـــەن و چارەســـەری کێشـــەکانیان بکـــەن، » ئەمە بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی کە مـوشریکان حـوکم بـۆلای طـاغوت ـان دە گێـڕنەوە و گـــوێڕایەڵی دەکەن و فەرمـــان بەرداری دەبـــن..وە بەڵـــگەش لەســـەر پەرســـتنی طـاغوتان لە لایان مـوشریکانەوە وەتەی رسـول الله ـیە ﷺ : عـن أبي هريـرة أن الرسـول صـلى الله عليـه وسـلم قـال : «.. يجمـع الله النـاس، فيقـول: مـن كان يعبـد شـيئاً فليتبعـه، فيتبـع مـن كان يعبـد الشـمس، ويتبـع مـن كان يعبـد القمـر، ويتبـع مـن كان يعبـــد الطواغيـــت،.. والى اخـــر حـــديث.[19]» واتا : لە باوکی هريرةـــەوە [ الله

١٨ [سورة النساء:60|تەفسیری ئاسان]
١٩ [ رواه البخاري (7437)، ومسلم (182) ]

لێـــی ڕازیبێــت ] پێغەمــبەر ﷺ فەرمــووی : .. الله تعــالی خەڵکــی لە ڕۆژی قیــامەت کــۆ دەکاتەوە و دەفەرموێــت هەر کەســێک شــتێکی پەرســتوە ئەوا با دوای بکەوێــت ، جــا ئەوەی خــۆر ــی پەرســتەوە دوای خــۆر دەکەوێــت ، وە ئەوەی کە مانــگ ــی پەرســتوە دوای مانــگ دەکەوێت ، وە ئەوەی طــاغوت ــی پەرســـتوە دوای طـــاغوت دەکەوێـــت ... تا کـــۆتای فەرمـــوودەکە .» وە ئەمە لە ڕونتریــنی بەڵــگەکانە لەســەر ئەوەی کە مــوشریکان لە دونیــا عیبــادەت و بەنــدایەتی تاغـوتایان کـردوە و وەهەر بـۆیەش شـوێنی تاغـوت دەکەون لە ڕۆژی قیـامەت. .

بەڵـگە لەسـەر شـوێن کەوتـنی مـوشریکان بـۆ طـاغوتان ، الله تعـالی دەفەرموێـت : «ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِيـنَ ءَامَنُـواْ يُخۡـرِجُهُم مِّـنَ ٱلظُّلُمَـٰـتِ إِلَى ٱلنُّـورِ وَٱلَّذِيـنَ كَفَـرُوٓاْ أَوۡلِيَـآؤُهُمُ ٱلطَّـٰغُـوتُ يُخۡرِجُـونَهُم مِّـنَ ٱلنُّـورِ إِلَى ٱلظُّلُمَـٰـتِ أُوْلَـٰٓئِـكَ أَصۡحَـٰـبُ ٱلنَّـارِ هُمۡ فِيهَـا خَـٰلِدُونَ»[20] واتا : الله پشـت و پـەنا و خـاوەنی ئـەو کەسـانەیە باوەڕیان هێنـاوە، لە تاریکاییــەکانی (گومــان و ســتەم) دەریان دەهێنێــت و دەیانبــات بــەرەو نــوورو ڕووناکی، ئەوانــەش کــە ڕێبــازی کـوفریان گرتۆتەبــەر، یارمــەتی دەرەکانیــان تــەنها ـ تاغوتەکانــە، لە نــوورو ڕووناکی دەریان دەهێــنن و بــەرەو تاریکاییــەکان دەیانبــەن، ئــا ئەوانــە نیشــتەجێی ناو ئــاگری دۆزەخــن و بــۆ هەمیشــە تیایــدا دەمێننــەوە.» وە ئەمە بەڵـــگەیە لەســـەر ئەوەی مــــوشریکان شــــوێن تاغــــوتان دەکەون ، وە تاغــــوتەکانیش لە ڕوناکی ئـــیمانەوە دەریان دەکەن بـــۆ تاریـــکایەکانی کـــوفر و بێ باوڕی ، وە الله تعـــالی لە ئـــایەتێکی تـــردا پـــێیان ڕادەگەیێنێـــت کە

---

٢٠ [ سورة البقرة:257|تەفسیری ئاسان ]

موشریکان شوێن تاغوتان دەکەون جەنگ و جیهاد لە پێناو تاغوتان دەکەن تا سەریان بخەن ، وەک الله خەوەن شکۆ دەفەرموێت : «ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ ..»[21]واتا : ئەوانەی ئیماندارن (تەنها) لە پێناوی الله ادا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و (تاغوت)دا دەجەنگن،.. » وە الله تعالی فەرمانمان پێدەکات بەوەی کە کوفر و بێ باوڕی بکرێت لە بەرامبەر تاغوتان و باوڕت پێیان نەبێت و عیبادەتیان نەکەیت ، وەک خۆی سبحانە وتعالی عما یشرکون دەفەرموێت : «أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا»[22] واتا : ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووروووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو الله نەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت،...» وە ئەمە لە ڕونترنی بەڵگەکانە بۆ زانینی فەرمانکردنی الله تعالی بە کوفر کردن بە تاغوت. وە الله خاوەن شکۆ لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : «فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ

---

٢١ [ سورة النساء:76|تەفسیری ئاسان ]

٢٢ [ سورة النساء:60| تەفسیری ئاسان ]

ٱلْـوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَـامَ لَهَـا وَٱللَّهُ سَمِيـعٌ عَلِـيمٌ»[23]واتا : ..جـا ئـەوەی باوەڕی نـەبێت بـە ـ تاغـوت ـ (کـە بریتیـە لە: هـەموو ڕێگـەو ڕێبـازو هێـزو بەرنامـەو لادان و بتێـک )و باوەڕی دامـەزراو بهێنێـت الله ، جـا بێگومـان ئەوکەسـە دەسـتی گرتـووە بـە بـەهێزترین هـۆکاری ڕزگارییـەوە، شـوێن دامـەزراوترین بـیروباوەڕ کـەوتووە، کـە هـیچ پسـان و هەڵوەشـاندنەوەیەکی بـۆ نی یـە و هەمیشـە پتـەو و دامـەزراوە، الله تعـالی بیسـەرو زانایـە.» لێـردا الله تعـالی کـوفر کـردن بە تاغـوتی بـۆ مەرجی موسـڵمان بـوون دانەوە . وە لە پـێش ئـیمان هێنـان بە الله تعـالی ـی داناوە وەک لەسـەرتادا دەفەرموێـت : «يَكْفُـرْ بِـٱلطَّٰغُوتِ» وە لە دوای ئەوە دەفەرموێـت : «وَيُـؤْمِنۢ بِـٱللَّهِ» پاشـان لە دوای ئەنجامـدانی ئەو دوومەرجە ئەوکات الله تعـالی هەواڵـی ئەو کەسـەمان پێـدەدات کە بەهـۆی ئەنجامـدانی ئەو دو کارە دەسـتی گرتـوە بە ئیسـلام و لااله الا الله وە . وەک لە دوای ئەو دوومەرجە دەفەرموێـت : «فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ» .

جـا ئەوانەی لە پێشـو باسـمان کـرد لە باسی – الهـة – و – انـداد – و – ارباب – و – الطـاغوت - گەر هەر یەکێـک لەم سـیفەتانە چـوە سـەر کەسێک کە پێـی ڕازیبوو یان خـۆی داوایکـرد یان پێـی خـۆش بـوو یان بێـدەنگ بـوو لە کاتێکـدا دەی تـوانی بێـدەنگ نەبێـت ئەوا ئەوکەسـە دەبێـت خـۆی و

---

٢٣ [ سورة البقرة:256|تەفسیری ئاسان ]

سـیفاتەکەشی نەفی بکەیـت ، وە لێـرە بەر چـاو ڕونیێـک دەدێـن کە  پێغەمـبەران علـیهم السـلام و مەلائـیکە و پیاوچـاکان ئەوانە ئەو سـیفتانەیان بەسـەر دا ناچەسـپێت چـونکە ئەوان ڕازینـین ئەو سـیفەتانیان بـدرێتە پـاڵ بـۆیە ، مەبەسـت لە وەی کە دەوترێـت گەر بێـدەنگ بـوون لە ئاسـت ئەو سـیفەتانە ڕازیبـونە پێـی ئەمە بـۆ کەسـێکە کە بتوانێـت ڕازی نەبـوونی خـۆی دەربخـات و بە وڵام دابێـت لە بەرامـبەر ئەوکەسـانەی ئەو سـیفەتانەی دەدەنە پـاڵ . بەڵام پێغەمـبەران علـیهم السـلام مـردون وە ڕازی نـین بەو سـیفەتانە بەڵکـو ئەوان بـۆ ئەوە نێـردراونن کـە بەخەڵکی بڵـێن ئەی خەڵکی ئێـوە هـیچ پەرسراوێکتـان نیە کە شـایەنی پەرسـتن بێـت بەحەق تەنهـا الله تعـالی نەبێـت ، وەک الله تعـالی بۆمـان باسـدەکات و دەفەرموێـت : «وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ»[24] واتا : ئێمـە پـێش تـۆ هـیچ پێغەمبـەرێکمان ڕەوانـە نـەکردووە، کـە وەحـیمان بـۆ نـەناردبێت بـەوەی کـە: بێگومـان هـیچ خوایـەک نـیە جگـە لە مـن و دەبێت هەر من بپەرستن.

بـۆیە پێغەمـبەران و مەلائـیکە علـیهم السـلام وە پیاوچـاکان رحمهـم الله ، ئەوانە ئەوسـیفەتانەیان ناچێـتە سـەر کە بڵـێن ئەوان الهـة ـــن یان انـداد ـــن یان ارباب ـــن یان الطـاغوت ـــن العیـاذبالله . بەڵام گەر کەسـێک داوا لەیەکێـک لەوان بـکات لە کارێـک ڕزگـاری بـکات یان کارێکـی بـۆ ئاسـان بـکات یان خێرێکـی بـۆ بێنێـت یان قـوربانی بـۆ بـکات یان هەر عیبادەتێکیـان بـۆ بـکات [ لەو

---

٢٤ [ سورة الأنبياء:25|تەفسیری ئاسان ]

عیبـــادەتانەی کە بە ئەنجـام دانی بـۆ غەیـری الله خـاوەنکەی لە ئیســلام دەردەکات بێبـاوڕ دەبێـت ] ئەوا ئەو کەسـە موشریـک دەبێـت و لە دیـن دەر دەچێـت. بەڵام ئەو کەســەی کە بــۆی ئەنجــام دراوە جــاگەر پێغەمــبەر بێــت یان مەلائـیکە یان پیاوچـاکان ، ئەوا هـیچ زیانێکـی بـۆ ئەوان نـیە چـونکە ڕازی نـین و ڕەتی دەکەنەوە ، بەڵام گەر کەســێک عیبــادەتەکەی بــۆ کەســێک کـرد کە عیبــادەت بــۆ کـراو ڕازی بــوو بەوشــتە یان پــێ خــۆش بــوو یان بێــدەنگ بــوو . ئەوا ئەوکات ئەوەی پەرســتنەکەی ئەنجــام داوە وە ئەوەی پەرســتنەکەی بــۆ ئەنجــام دراوە هەردووکیــان بێباوڕ دەبن و لەدین دەردەچن.

## «چۆنیەتی نەفی کردنی پەرستراوەکان»

نەفی کردنی ئەو چوار جۆرە پەرســتراوانەش بەم شــێوەیەیە کە بریتیە لە پێنج خاڵ -یەکەم- بیرو باوڕت وابێـت کە عیبـادەت کردن بۆ غەیری الله تعـالی پوچ و باتڵە بەرامبەر ئەوەی کە دەی پەرســتێت وە ئەوەی دەپەرســترێت ، -دووەم- وە واز لەو کەســـە بێنێت کە عیبادەت بۆ غەیری الله تعالی دەکات وە ئەکەسی کە لەغەیری الله تعالی عیبادەتیان بۆ دەکرێت ، مەبەستیش لەواز هێنا ئەوەیە کە هاوڕێیەتی و ڕەفاقەتیان نەکیت وە سەردان و هاتوو چوی نەکەیت ، مەبەست لەوەیە نەک وازی لێبێنێت بڵێت چیدەکات با بیکات ، -ســێەم- وە ڕقێکی تەواوت لەو کەســانە بێتەوە کە عیبادەت بۆ غەیری الله تعالی دەکەن وە ڕقت لەو کەســـەش ببێتەوە کە عیبادەتی بۆ دەکرێت لە غەیری الله تعالی وە ڕازی و بێدەنگە لە ئاســـتی یان پێی خۆشـــە یان داوادەکات .

-چوارەم- بیرو باوڕت وابێت کە ئەوکەسەی لەغەیری الله تعالى شتێکی تر دەپەرستێت وە ئەوکەسەی لە غەیری الله تعالى پەرستنی بۆدەکرێت وە ڕازی و بێدەنگە لە ئاستی یان پێی خۆشە یان داوادەکات ئەوا ئەو دوو کەسە هەردووکیان کافر و بێباوڕن و پەیوەندیان بەدینی ئیسلامەوە نەماوە ئەگەر چی خۆشیان بە موسڵمان بزانن و نوێژ و ڕۆژو ئەنجام بدەن. -پێنجەم- وە دژایتان بکەیت دەژایەتی ئەوکەسە بکەیت کە عیبادەت بۆ غەیری الله تعالى ئەنجام دەدات وە دژایەتی ئەو کەسەش بکەیت کە لەغەیری الله تعالى دەپەرسترێت وە ڕازی و بێدەنگە لە ئاستی یان پێی خۆشە یان داوادەکات ، وە بەڵگەش لەسەر ئەم پێنج خاڵانە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە کاتێک کە موشریکان داویان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە بتەکانی ئەوان بپەرستێت الله تعالى سورتی الکافرون دابەزێند کە تێدا دەفەرموێت : «قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ=لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ»ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە دەبێت موشریکان بە کافر و بێباوڕ بزانیت لە بەر ئەوەی دەفەرموێت : قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ. ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەی کۆمەڵی بێ باوەڕ و خوانەناسان.) الله تعالى فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات. کە ئەوکەسانەی عیبادەت بۆ غەیری الله تعالى ئەنجام دەدن . بە کافر و بێباوڕ ناویان بهێنێت.وە لە ئایەتی دوای ئەو دەفەرمویت : لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ . من هەرگیز ئەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن ناپەرستم (چونکە من الله پەرستم). وەئەمە بەڵگەیە لەسەر وازهێناو دورکەوتنەوە لە بتەکان و بت پەرستان . وەک الله تعالى لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : «وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا .»[25] واتا :شێوازێکی جوان بەجێیان بهێڵە.» وە الله تعالى لە ئایەتێکی تر پێمان

---

٢٥ [ سورة المزمل:10|تەفسیری ئاسان ]

دەفەرمویت :«قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ...»[26] واتا : ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای سالەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە الله ــی تاك و تەنها دەهێنن، ..» جا دەبێت ئێمە چاو لە پێغەمبەر ابراهیم بکەین علیه السلام . کە چی بەموشریکان فەرموو ، فەرمووی ئێمە بریئین لەئێوە هیچ پەیوەندیکمان بەسەریەوەکەوەنیە. وە ئێمە بێباورێن و باوڕمان بەو بتانە نیە کە ئێوە دەیان پەرستن لەغەیری الله ، وە ئێمە دژایەتیتان دەکەین ،وە لە دڵەوە ڕقێکی تەواومان لێتانە لە خۆتان و ئەوانەشی کەردووتانە بە خوای خۆتان لەغەیری الله تعالی . جا ئێمە دەبێت چاو لە پێغەمبەران بکەین علیهم السلام بۆ ئەوەی نەکوینە هەڵە و شیرک و بێباوڕیەوە .

خاڵی یەکەم بریتیە لەم بەشە «كَفَرْنَا بِكُمْ» سورة الممتحية -4

خاڵی دووەم بریتیە لەم بەشە « لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ» سورة الكافرون -2- یاخود «إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ» سورة الممتحية -4

٢٦ [ سورة الممتحنة:4|تەفسیری ئاسان ]

خاڵی سێیەم بریتیە لەم بەشە «وَٱلْبَغْضَآءُ»سورة الممتحية -4
خاڵی چوارەم بریتیە لەم بەشە «قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ»سورة الكافرون -1
خاڵێ پێنجەم بریتیە لەم بەشە «ٱلْعَدَٰوَةُ»سورة الممتحية -4

# «چۆنیەتی ئیسپات کردنی عیباداتەکان بۆ الله تعال»

وە ئێستا زانیمان کە ئەوشتانە چین کە لەغەیری الله تعالی دەپەرسترێن ، وە جورەکانیمان باسکرد وە شێوەی ڕەتکردنەوە و نەفی کردنیمان باسکرد جا ئەمەی باسکرا بریتی بوو لەم بەشەی – لااله الاالله – کە -لااله- یە ، ئەمەی باسکرا لەپێشوو ئەوە تەواو بوو ، واتا ئەگەر کەسێک ئەوانەی لە پێشوودا باسمان کرد ئەنجامی بدا ئەوە ئەوبەشەی – لااله الاالله - کە -لااله- یە بەجێی هێناوە و تەواوی کردوە ، واتا نیوەی – لااله الا الله –ی ئەنجام داوە و ئەوەی بەڕاست داناوە کە هیچ پەرستراوێک نیە بۆ پەرستن بەحەق ، بەڵام ئەوبەشەی ماوە کە بریتیە لە – الاالله – ئەوەیش بریتیە لەوەی کە ئەو سیفاتانەی کە تایبەتە بە الله تعالی بەڵام هەندێک لە مرۆڤ و پەریەکان داویانەتە پاڵ مەخلوقات و بەوانیان بەخشیوە و بۆ ئەوانی دەچەسپێنن و دانی پێدادەنێن ، ئەوا ئێمە دەبێت بیدەینەوە پاڵ الله تعالی وە بۆ ئەو بیچەسپێنین و دانی پێدابنێین ، وە نەفی و ڕەتی بکەینەوە بۆ غەیری الله تعالی سبحانە عما یشرکون ، وە ئەمەش بەم شێوەیە دەکرێت کە ئەوسیفاتانەی لە پێشو باسمان کرد کە درابوە پاڵ مەخلوقات ، ئێمە بیدەینەوە پاڵ الله تعالی و بۆ ئەوەی بچە سپێنین واتا ئەو جۆرە عیبادەتانەی کە بۆ – الهة – انداد – ارباب -الطاغوت – ئەنجام دەدارە ئەوا کەسی موسڵمان بۆ الله تعالی ئەنجام بدات .

له پێشوو باسمانکرد که  چ جۆرە عیبادەتێک بۆ ئەوان ئەنجام دەدرێت، وە کەسی موسڵمان پێوستە ئەو عیبادەتانە ، بۆ  الله تعالى ئەنجام بدات ،

ئەو عیبادەتانەی بۆ – الهة – دەکران بریتی بوون لە چەند جۆرێکی پەرســـتن ، وەک لە پێشو باسمان کرد ، جا ئێمە دەبێت ئیسپاتی  ئەوە بکەین کە تەنها  الله  - اله – ی حەقە وەک  الله تعالى دەفەرموێت : «وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ»[27] واتا : خوای  ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، هەر ئەو خوایەش بەخشـندەو میهرەبان و بەبەزەییە. »  بۆیە پێوسـتە کە کەسی موسـڵمان دان بە -اله- یەتی  الله تعالى دابنێت  و  چســـپاوی بکات ، وە -اله- یەتی غەیری  الله تعالى ڕەت بکاتەوە و قبوڵی نەکات ، چونکە تەنها یەک -اله- هەیە بەحەق بۆ پەرســـتن وە ئەویش تەنها  الله تعالى یە ،

وە پێویسـتە کە ئیسـپاتی ئەوە بکەین کە ئێمە نابێت لە هیچ شتێکمان لە  الله تعالى زیاتر خۆش بوێت ، یان هاوشـێوەی  الله تعالى خۆشـمان بوێت ، موشریکان -انداد- ـــەکانیان هاوشێوەی  الله تعالى خۆش دەویست  ، وە مەیلی دڵیان بۆ لای دەچوو بۆ عیبادات و پەرسـتن ، بەڵام کەسی موسـڵمان دەبێت زۆرترین   خۆشـەویسـتی و مەیلی دڵی بۆ  الله تعالى بێت . وەک  الله تعالى باسی دەکات و دەفەرموێت : «وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ[28]» واتا : (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا ) هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی  الله پەرست بێت،

٢٧ [ سورة البقرة:163|تەفسیری ئاسان ]
٢٨ [ سورة البقرة:165| تەفسیری ئاسان ]

شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویيەکانی الله ناکەوێت و) خۆشەویستی و ســـۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو تووله ڕێگەیانه و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران الله یان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر الله یان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت) ...». بۆیە پێوســـتە موســـڵمان زۆرترین و خۆشـــەویســـتی بۆ الله تعالى بێت ، هیچ شـــتێکی لە الله تعالى زیاتر خۆشـــنەوێت. چونکە خۆشـــەویســـتیتش جۆرێکە لە عیبادەت بۆ الله تعالى ، بۆیە گەر کەســـێک کەسێکی هاوشێوەی الله تعالى خۆش ویست ئەوا شیرکی بڕیارداوە بۆ الله تعالى ،.وە -انداد – بەمانی هاوشـێوە دێت. بۆیە نابێت لەهیچ جۆر و بوارێک دا کەسێک یاخود دارێک یان بەردێک یان پێغەمبەرێک یان مەلائیکەتێک یان حزبێک یان هەر شـتێک لە مەخلوقات . بکەین بە هاوشـــێوەی الله تعالى ، وەک چۆن موشریکان لە بواری خۆشەویستی دا کەسانێکیان کرد بە انداد و هاوشـێوەی الله . لە خۆشەویستی دا ، نابێت کەســـان هاوشـــێوەی الله تعالى خۆش بوێت یان هاوشـــێوەی الله تعالى لێی بترســـین یان هاوشـــێوەی الله تعالى بەگەورەی بزانێت وە هەموو ئەوشـــتانەی کە مافی الله تعالى لەســـەر بەندەکانی ، نابێت ئێمە بەهیچ شـــێوەیک شـــتکمان بە هاوشـــێوەی الله لەدڵدابێت ،

وە پێویستە کە سیفەتی -الرب- کە جەمعەکەی -ارباب- ــــە ، بۆ الله تعالى ئیسپاتی بکەین و بۆ غەیری ئەویش ڕەتی بکەینەوە نەفی بکەین ، چونکە تەنها الله تعالى رب ــــی ئێمەیە. وەک الله تعالى دەفەرموێت : «ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ

شَیۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَیۡءٖ وَكِیلࣱ»[29] واتا : ئا ئەو الله ـــیە پەروەردگارتانە، جگە لەویش هیچ خوایەکی تر نیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە هەر ئەو زاتە بپەرستن و بەندایەتی تەنها ئەو بکەن، ئەو الله ــــــیە ئاگادارو چاودێری هەموو شــتێکە.» بۆیە دەبێت موسڵمان تەنها الله بە رب ـــــی خۆی بزانێت. وە ئیسپاتی ربوبیة بۆ الله تعالى بکات .. وە -رب- بەواتای -بەخێوکەر- دێت یان -بەڕێوبەر- دێت بۆیە نابێت موسڵمان بیرو باوڕی وابێت کە مەخلوقات -رب- ـــی ئەون یان وابزانێت کە جگە لە الله تعالى -رب- یکی تر هەیە ، لەمەش ئەوە فێر دەبین کە هیچ شـــتێـک مرێنەر نیە وە زیندووکەرەوە نیە وە شـــیفادەر نیە وە رزق دەرنیە وە باران بارێنەر نیە وە دروســتکەر نیە وە حوکم و یاســـادانەر نیە وە ڕزگار کەرنیە لەتەنگانە وە الی خر.. هیچ شـــتێک نیە ئەوانەی بەدەســــت بێت تەنها الله تعالى نەبێت ، هەر ئەوە هەموو ئەم شــــتانەی بەدەستە ، بۆیە نابێت ئێمە ئەو سیفاتە کە سیفاتی -رب- ــــە بۆ غەیری الله تعالى ئیسپاتی بکەیت، وەک هەندێک لە خەڵکی کە داوای شیفا و یارمەتی و رزق و باران برین لە قەبرەکان دەکەن هاوشێوەی سوفی و هەندێک لەخەڵکی نەزانی بەناو موسڵمانان ، بەڵکو موســـڵمان دەبێت بیرو باوڕی وابێت کە تەنها یەک -رب- هەیە وە ئەویش -رب- ــــــی هەموو جیهانیانە ، جیهانی مرۆڤ وە جیهانی مەلائیکە وە جیهانی پەریەکان (پەری واتا جنۆکە) وە جیهانی ئاژەڵانی وشکانی وە جیهانی ئاژەڵانی ئاوی . والی اخر وە بەڵگەش وتەی الله تعالى ـــــیە وەک دەفەرموێت :«ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَـٰلَمِینَ»[30] واتا :

---

٢٩ [ سورة الأنعام:102|تەفسیری ئاسان ]

٣٠ [ سورة الفاتحة:2|تەفسیری ئاسان ]

سوپاس و ستایش هەر شایستەی الله ـیە و بۆ الله ـیە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە.

بەڵام خاڵی چوارەم کە وەک پێشتر باسمان کرد ئەویش بریتبوو لە الطاغوت، ئەمەیان شێوەی ئیسپات کردنەکەی جیاوازە ، چونکە ناکرێت ئێمە بڵێن سیفەتی طاغوت بۆ الله تعالی دەچەسپێنێت ، وە هۆکاری جیاوزی ئەمەش ئەوەیە کە بەشتێک دەوترێت تاغوت کە سنوری بەندایەتی بەزاندبێت بۆ خوایەتی ، وە بۆیەش بۆ الله تعالی وەکو سێ جۆرەکانی تر {مەبەست لە الهة انداد و رباب ـە} ئیسپات ناکرێت چونکە ئەگەر ئێمە بڵین ئیسپاتی طاغوت دەکەین بۆ الله . ئەوە واتای ئەوەیە کە الله تعالی خۆی لە ڕاستی دا پەرستراوی حەق نیە ، بەڵکوو کراوە بە پەرستراوە ، وە ئەمەش هەڵەیە و کوفرە ، بەڵکوو دەڵێن ئێمە ئەو چەند سیفاتەی کە بۆ تاغوتان ئیسپات دەکرێت لە کاتێک دا حەق و مافی الله تعالی یە ،ئێمە نەفی دەکەین بۆ تاغوتەکە وە لەگەڵ ئەوشدا ئیسپاتی دەکەین بۆ الله تعالی کە هەر شایستەیە بەوە ، وەک الله تعالی دەفەرموێت : «فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ»[31] واتا : ، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک )و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە الله ،جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگاریەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ

٣١ [ سورة البقرة:256]تەفسیری ئاسان ]

کـەوتووە، کـە هـیچ پسـان و هەڵوەشـاندنەوەیەکی بـۆ نی یـە و هەمیشـە پتـەو و دامـەزراوە، الله تعـالی ـش بیسـەرو زانایـە» بەڵـگەش لەسـەر ئەوەی کە ئیسـپاتی عیبـادەتکردن بکەیـن بـۆ الله تعـالی ، وە،نەفی و ڕتکـردنەوە بکەیـن بـۆ طـاغوت ، وتەی الله تعـالی ـیە وەک دەفەرموێـت : «وَلَقَـدۡ بَعَثۡنَـا فِي كُلِّ أُمَّـةٍ رَّسُـولًا أَنِ ٱعۡبُـدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُـواْ ٱلطَّٰغُـوتَ..»[32] واتا : سـوێند بـە الله بێگومـان ئێمـە لەناو هـەر گـەل و نەتەوەیەکـدا پێغەمبـەرێکمان ڕەوانـەکردووەو پـێمان ڕاگەیانـدووە کـە پێیـان بڵێـت: تـەنها الله بپەرسـتن، خـۆتان دوورە پـەرێز بگـرن لە هـەموو پەرسـتراوێکی تـر،..» وە لە ئـایەتێکی تـردا دەفەرموێـت : «وَٱلَّذِيـنَ ٱجۡتَنَبُـواْ ٱلطَّٰغُـوتَ أَن يَعۡبُـدُوهَا وَأَنَابُـوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُـمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ فَبَشِّرۡ عِبَـادِ»[33] واتا : جـا ئەوانـەی کـە خـۆیان دوورە پـەرێز گرتـووە لە هـەموو ئـەو شـتانەی خـەڵکی دەیپەرسـتن، جگـە لە الله تعـالی و بەتەوبـە و پەشـیمانیەوە گەڕاونەتـەوە بـۆ لای خـوا، مـژدەی سـەرکەوتن و سـەرفرازی و بەختـەوەری و کامـەرانی بـۆ ئەوانەیـە، دە مـژدە بـدە بـەو بەندانـەم...» وە بەڵـگەش لەسـەر ئەوەی حـوکم و یاسـادانان تەنهـا حەق و مـافی الله تعـالی ـیە ، وتەی الله تعـالی ـیە وەک دەفەرموێـت : «.. إِنِ ٱلۡحُـكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَـرَ أَلَّا تَعۡبُـدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ذَٰلِكَ ٱلدِّيـنُ ٱلۡقَـيِّمُ وَلَٰكِـنَّ أَكۡـثَرَ ٱلنَّـاسِ لَا يَعۡلَمُـونَ»[34] واتا : ... بەڕاسـتی حـوکم و فـەرمانڕەوایی جگـە لە الله شایسـتەی کـەسی تـر نی یـە، فەرمانیشـی داوە جگـە لە خـۆی کـەسی تـر نەپەرسـتن، هـەر

٣٢ [ سورة النحل:36|تەفسیری ئاسان ]
٣٣ [ سورة الزمر:17|تەفسیری ئاسان ]
٣٤ [ سورة يوسف:40|تەفسیری ئاسان ]

ئـەوەش ئـایین و بەرنامـەی پەسـەند و ڕاسـت و دروسـت و بـەنرخ، بـەڵام زۆربـەی خـەڵکی ئـەم ڕاستیانە نازانـن و لێـی بێ ئاگـان.» وە لە ئـایەتێکی تـر دەفەرموێت : «..أَلَا لَهُ ٱلْخَلْـقُ وَٱلْأَمْـرُ تَبَـارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِـينَ»[35] واتا :...ئاگـادار بـن و بـزانن و تێفکـرن کـە: هـەرچی دروسـتکردن و بڕیاردانـە هـەر بـۆ ئـەوە(واتا هەر بـۆ الله ـیە)، (کەواتـە دەبا هـەمووان فەرمانبـەرداری ئـەو بـین و لە فـەرمانی دەرنـەچین)، مـــوبارەک و پـــیرۆزو گەورەیـــە زاتی ( الله ) پـــەروەردگاری جیهانیـــان.» وە پێویســتە ئیســپاتی ئەوەش بکەیــن کە تەنهــا شــوێن بەرنامە و ڕێبــازی الله تعــالی بکەویــن ، وە نەفی ڕێگــا و ڕێبــازی غەیــری دیـنی الله تعــالی بکەیــن و قبــوڵمان نەبێــت ، وەک لە پێــوش کەباسی ئەوکەســانەمان کـرد دە شــوێن تاغــوت کـوت بـوون و شـەڕیان بـۆ سەرخسـتی -طـاغوت- دەکـرد ، بەڵام ئەوانەی کە ئـیمان دار بـوون و شــوێن بەرنامەی الله تعــالی کەوتبــوون شــەڕیان لە پێنــاو الله تعــالی و دیـنی الله تعـالی دەکـرد تا دیـنی الله تعـالی سـەربکەوێت و بەرز بێـت ، وەک الله تعــالی دەفەرموێــت : «ٱلَّذِيــنَ ءَامَنُــواْ يُقَٰتِلُــونَ فِي سَــبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِيــنَ كَفَــرُواْ يُقَٰتِلُـونَ فِي سَـبِيلِ ٱلطَّٰغُـوتِ..»[36] واتا : ئەوانـەی ئیمانـدارن (تـەنها) لە پێنـاوی الله ـــدا دەجـــەنگن (بـــەڵام) ئەوانـــەی بێ باوەڕن لە پێنـــاوی ســـتەمکارو زۆردار و (تاغـوت)دا دەجـەنگن،...» جـا هەر کەسـێک کە دەوێـت کە ئیمانـدار بێـت ئەوا دەبێـت تەنهـا و تەنهـا لە پێنـاو الله تعـالی ـدا بجەنگێـت و شـوێن ڕێبـازی ئەو

---

٣٥ [ سورة الأعراف:54|تەفسیری ئاسان ]

٣٦ [ سورة النساء:76|تەفسیری ئاسان ]

بکەوێت. وەک الله تعالی لە ئایەتێکی تردا فەرمانمان پێدەکات بەوەی شوێن قورئان و فەرمووده بکەین ، وە نە هیشمان لێدەکات لەوەی شوێن ڕێگا و ڕێبازی تر بکەوین ، وەک دەفەرموێت : «ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ»[37] واتا : (خەڵکینە) شوێنی ئەو (بەرنامەیە) بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هێنراوەتە خوارەوە، جگە لەو زاتە شوێنی هیچ پشتیوان و خۆشەویستێکی تر مەکەون، کەم یاداوەری و پەند وەردەگرن و بیردەکەنەوە .! » وە لە ئایەتێکی تردا ئەو کەسانە بەزەررمەند و خەسارت مەند ناودەبات کە جگە لە دینی ئیسلام کەبەنامەی الله تعالی سیە پەیڕەودەکەن ، وەک دەفەرموێت : «وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ»[38]واتا: جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە» جابۆیە کەسی موسڵمان دەبێت ئیسپاتی ئەوەبکات و قبوڵی بێت کە تەنها شوێن دینی الله تعالی بکەوێت ، وە نەفی غەیری دینی ئیسلام بکات و ڕەتی بکاتەوە قبوڵی نەبێت ،

## «مەرجەکانی لااله الاالله»

---

٣٧ [ سورة الأعراف:3|تەفسیری ئاسان ]
٣٨ [ سورة آل عمران:85|تەفسیری ئاسان ]

وه جگه له‌و دوو ڕوکن ـــــه‌ی که باسکرا هه‌شت مه‌رج هه‌یه بۆ قبوڵبونی ئه‌م -لااله الاالله- ـــیه واتا قبوڵبونی ئه‌و دوڕکن ـــه له‌سه‌ر ئه‌م هه‌شت مه‌جه‌ره وه‌ستاوه، کاتێک که تۆ ئه‌م نه‌فی کردن و ئیسپات ـــه ئه‌نجام ئه‌ده‌یت ده‌بێت به‌م هه‌شت مه‌رجه‌وه ئه‌نجامی بده‌یت وه ئه‌و مه‌رجانه‌ش بریتین له -العلم -و- الیقین -و- الإخلاص -و- الصـــدق -و- المحبة -و- الإنقیاد -و- القبول -و- الکفر بما یعبد من دون الله- وه هه‌ر یه‌کێک له‌م مه‌رجانه هه‌ڵوه‌شـێنه‌ره‌وه‌کی هه‌یه. ئه‌وانیش بۆ -العلم←الجهل- هه‌یه وه بۆ -الیـقـین←الشـــــک- هه‌یه وه بـۆ -الإخـلاص← الشـــــک- هه‌یه وه بـۆ -الصـدق←الکذب- هه‌یه وه بۆ -المحبة←البغض- هه‌یه وه بۆ -الإنقیاد←الترک- هه‌یه وه بۆ-القبول←الرد- هه‌یه وه -الکفر بما یعبد من دون الله ←پێچه‌وانه‌که‌ی هه‌یه- وه ئه‌م مه‌رجـانه‌ش له قورئـانی پیرۆز و فه‌رموده به‌ره‌که‌ت داره‌کانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ وه‌رگیراون وه به‌نبوونی یه‌کێک له‌م مه‌رجانه. یان هه‌بونی یه‌کێک له دژه‌کانی ئه‌م مه‌رجانه ئه‌وا -لااله الا الله- هیچ ســـودێک به خاوه‌نه‌کی ناگه‌یێنێنت و ســـــودنی بۆی نابێت ئه‌گه‌ر چی چه‌ندین جاریش دووباره‌ی بکاته‌وه ،

## «مه‌رجی یه‌که‌م العلم»

مـــــــــه‌رجی یه‌که‌م العلم : که‌سی موسڵمان ده‌بێت بزانیت که مانای لااله الا الله چیه وه داواکاری چیه وه کاتێک وتت لااله الا الله ده‌بێت بزانێت چیده‌گۆڕێت به‌هۆی وتنی ئه‌م وشـــه‌یه‌وه ، وه ده‌بێت شـــاره‌زابێت به‌مانه‌که‌ی وه شـــاره‌زابیت به ڕوکن و مه‌رجه‌کانی ، هه‌ر وه‌ک الله تعالی ده‌فه‌رموویێت : «فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱســۡتَغۡفِرۡ

لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ..»[39] واتا : ئەی ئینســـان !! دەی کەواتا چاک بزانەو دڵنیابە جگەلە الله ، هیچ خوایەکی ترنیە، داوای لێخۆشـــبوونی گوناه بۆ خۆت و ئیمانداران لەپیاوان و ئافرەتان هەر لەو بکە...».. وە لەفەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ بەمەرج گیراوە بۆ قبوڵبونی ئەو وشـــە گەورە و بەڕێزە وەک لە فەرمودەی عثمان بن عفان هاتوە (الله لێی ڕازیبێت) قال رسو الله ﷺ : «مَن ماتَ وهو يَعْلَمُ أنَّه لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، دَخَلَ الجَنَّةَ»[40]واتا : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەرکەســـێک مرد و وە علم و زانیاری هەبێت بەوەی هیچ پەرسـتراوایک نیە شـایەنی پەرسـتن بەیت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، ئەوە دەچێتە بەهەشـــتەوە، ». بۆیە کەسی موســـڵمان پێویســـتە بزانێت مانای لااله الا الله چیە و داوکاری چیە و ڕێگری لەچی دەکات ، جاگەر کەسێک زانیاری بە ماف و حەقەکانی هەبوو وەکاری پێکرد ئەوا مەرجەێکی تەواو بوە ، وە هەر کەســـێک زانیاری بە مانای نەبوو وە نەیدەزانی حەق و مافەکانی چیە ، ئەوا لێی قبوڵناکرێت ئەگەرچی چەندین جاریش بیڵێتەوە ، چونکە لەئایەتەکە الله تعالی فەرمان دەکات کە ماناکەی بزانیت ، وە فەرمودەکەش دەیکات بەمەرج بۆ قبوڵبونی لااله الا الله ، وەک لە سـەرتاش باسـکرا کە جەهل و نەزانیت ، علم و زانین ڕەت دەکاتەوە و هەڵیدەوەشـێنێتەوە ، بۆیە کەســێک کەعلمی پێ هەبێت دژەکەی لەسەر لادەچێت دە جەهل و نەزانیە .

## «مەرجی دووەم الإخلاص»

---

٣٩ [ سورة محمد:19|تەفسیری ئاسان ]
٤٠ [ صحیح مسلم | الرقم: 26 ]

وە مەرجی دووەم بریتیە لە - الإخلاص – واتا دەڵسوز بیت لە تێکڕای عیباداتەکانت بۆ الله تعالى ، وە دژی – الإخلاص - ـیش شیرکە ، وە الله تعالى فەرمانی پێکردوین کە دڵسۆزبین لە عیبادەتکردنمان بۆ الله تعالى وەکەس نەکەین بەشیرک و هاوبەش بۆی لە هیچ جۆرە عیبادەتێک دا ، وەک الله تعالى دەفەرموێت : «إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ»[41] واتا : یگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم تا حەق و ڕاستی ڕوون بکاتەوە، کەواتە هەر الله بپەرستە و هەر ملکەچ و دڵسۆزبە بۆ ئاین و بەرنامەکەی.» وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : «هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ»[42] واتا : ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتان ڕوو بەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن، سوپاس و ستایش بۆ الله ، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.» وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : «وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ..» [43] واتا : فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە اللهپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن..» وە لە فەرمودەی ابو هريرة [ الله لێی ڕازیبێت ] هاتوە کە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە : مَن أسْعَدُ النَّاسِ بشَفَاعَتِكَ يَومَ القِيَامَةِ؟ قالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: .. أسْعَدُ النَّاسِ بشَفَاعَتي يَومَ القِيَامَةِ، مَن قالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، خَالِصًا مِن قَلْبِهِ، أوْ نَفْسِهِ.[44]» واتا :

٤١ [ سورة الزمر:2|تەفسیری ئاسان ]
٤٢ [ سورة غافر:65|تەفسیری ئاسان ]
٤٣ [ سورة البينة:5|تەفسیری ئاسان ]
٤٤ [ صحيح البخاري | الرقم: 99 ]

ابوهريرة پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد : کێ سەرکەوتوو دەبێت بە شەفەعەکەتەت لە ڕۆژی قیامەت ؟.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوکەسە سەردەکەوێت بە شەفاعەتم لە ڕۆژی قیامەت کە بە دڵسۆزانە لە دڵیەوە یان لە نەفسیەوە بڵێت هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە دڵسۆزی بۆ الله تعالی لە عیبادەتەکان شتێکی گرینگ و پێوستە لەبەر ئەوەی دژی الإخلاص شیرک ـە.وە گەر دڵسۆز نەبێت لە پەرستنی الله تعالی و ئەنجامدانی فەرمانەکانی الله تعالی یان لە دڵسۆز نەبێت لە خۆ پارستن لە قەدەغەکراوەکان بۆ الله تعالی ئەو توشی شرک دەبێت ..

## «مەرجی سێیەم الیقین»

مەرجی سێیەم بریتیە لە -الیقین- واتا دڵنیابوونێکی کامل و تەواو ، وە پێچەوانەی الیقین ، الشک ـە. واتا گومان هەبوون یاخود دوودڵ بوون. جا کەسی موسڵمان نابێت هیچ گومانێکی هەبێت کە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە تەنها الله تعالی نەبێت ، وە دڵینابێت کە تەنها الله تعالی شایستەیە و شیاوە بۆ پەرستن ، وە الله تعالی لە بارەی بڕوا دارانەوە دەفەرموێت : «إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ...»[45] واتا : بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کەباوەڕیان بە الله و پێغەمبەری الله هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتەهیچ گومان و دوودڵیەکەوە..» وە لە فەرموودەی أبي هريرة رضي الله عنه . هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : «أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله, ولا

---

٤٥ [ سورة الحجرات:15|تەفسیری ئاسان ]

يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة»[46] واتا : شایەتی دەدەم ئەوەی کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت. وە من پێغەمبەری الله ـم ، وە ئەو بەندەیە بگاتەوە بە الله تعالی وە هیچ گومان و دوو دڵی لەو دوو شایەتیە نەبێت ئیلا دەچێتە بەهەشتەوە .» وە لە فەرموودەی معاذ رضي الله عنه ، هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : «ما مِن نَفسٍ تَموتُ تشهَدُ أن لا إلَه إلَّا اللَّهُ وأنِّي رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ يرجِعُ ذلِك إلى قلبِ موقنٍ إلَّا غفَرَ اللَّهُ لَها»[47] واتا ; هیچ نەفسێک نیە بمرێت و شایەتی دابێت بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە من [محمد ﷺ ] . نێردراوی الله تعالی ـم ، وە گەڕابێتەوە بۆلای الله تعالی وە دڵنیابێت لەسەر ڕاستی ئەوە شایەتیە [واتا یەقینی هەبێت بەوەی کە تەنها الله شایەنی پەستنە بەحەق وەمحمد ـیش نێردراوای الله تعالی یە]. ئیلا الله تعالی لێ خۆش دەبێت.» بۆیە کەسی موسڵمان پێویستە تەواو دڵنیابێت لە وەی کە تەنها الله تعالی شایەنی پەرستنە وە هیچ شتێک شایەنی پەرستن نیە بەحەق ، تەنها الله نەبێت .

## «مەرجی چوارەم الصدق»

٤٦ [ رواه مسلم | 27 ]

٤٧ [ صحيح ابن ماجه الصفحة أو الرقم: 3078 | خلاصة حكم المحدث : حسن صحيح / التخريج : أخرجه النسائي في ((السنن الكبرى)) (10975)، وابن ماجه (3796) واللفظ له، وأحمد (21998) ]

وه مەرجی چوارەم  بریتیه له الصدق  واتا ڕاستگۆیی  ، دەبێت کەسی موسڵمان ڕاستگۆیانه نەفی پەرسترەوه باطڵ و پوچەکان  بکات و إثباتی ئەوەش بکات که تەنها  الله تعالی شایستەی پرستنه ، نەک وەکو مونافیقەکان له دەروه و له ناو موسڵمان بڵێت لااله الا الله  وله دڵیشەوه بڕوای پێنەبێت  ، وەک  الله تعالی حاڵی مونافیقەکانمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت : «وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ»[48]  واتا : کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوه دەڵێن: ئێمه ئیمانداریـن و باوەڕمان هێناوه!!، کەچی کاتێك به تەنها دەمێننەوه له لای شەیتانه گەوره و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمه لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمه تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین!!»  بۆیه دەبێت موسڵمان ڕاستگۆیانه بڵێت هیچ پەرستراوێک نیه شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها  الله  نەبێت ، وه  الله تعالی ـیش خەڵکی تاقیدەکاتەوه تابزانێت ئایه ڕاستگۆ بوون له وتنی لااله الا الله  یاخود درۆزن بوون ، وەک الله تعالی دەفەرموێت : «أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ(2)وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ(3)»[49] واتا : ئایا خەڵکی وایانزانیوه، وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن که بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوه، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوه و تووشی سزا و ئازار نەکرێن ؟(2)سوێند به الله  بێگومان ئێمه ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوه به جۆرەها شێوه، تا  الله تعالی(له جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووه بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها

---

٤٨ [ سورة البقرة:14|تەفسیری ئاسان ]

٤٩ [سورة العنکبوت : ٢-٣|تەفسیری ئاسان]

درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.(3)» وە الله تعالی لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : «فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ(5)وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ(6)»[50] واتا : جا ئەوەی (ماڵ و سامان و زانستی و ... هتد) دەبەخشێت و پارێزکار و لە اللهترسە..(5)بڕوای بتەوی بە پاداشتی چاک و بەنرخی خوایی هەیە...(6)» هەندێک لەزانایان [ رحمة الله علیهم ] لە تەفسیری ئایەتی شەشەم دەفەرموون :وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ واتا لااله الا الله بەڕاست دابنێت . ئەو زانایانەش وەک شێخ عبدالرحمان سعدی لە تەفسیرەکەی خۆی دا[51]. ئیمامی القرطبی لە تەفسیرەکەی خۆی دا ، وە هەر ئەویش دەڵێت ئیمامی الضحاك و السلمی ابن عباس ئەو تەفسیرە دەڵێن[52]. وە امام رازی یی هەمان تەفسیر دەڵێت[53]: وە امامی الطبری لە ئیمامی مجاهد ـەوە نەقڵدەکات کە هەمان تەفسیری کردوە[54] وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : «أَبشِروا ، و بَشِّروا مَن وراءَكم ، أنه مَن شهِد أن لا إلَهَ إلا اللهُ صادقًا دخل الجنَّةَ»[55] واتا : «موژدە بدەن بەوانەی دوای خۆتان ، موژدە بدەن بەوانەی دوای خۆتان ، بەدڵنیایەوە هەر کەسێک ڕاستگۆیانە شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله نەبێت، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە .» بۆیە کەسی موسڵمان دەبێت ناخ و دەروەی وەک یەک بێت لە بەرامبەر ئەم وشە بەڕێز و گەورەیە . کە گەوەترین مافی الله تعالی یە لەسەر بەندەکانی ،

٥٠ [ سورة اللیل:5-6 | تەفسیری ئاسان ]
٥١ [ التفسیر المیسر ]
٥٢ [ المفاتیح الغیب التفسر الکبیر ]
٥٣ [ الجامع الاحکام القرآن ]
٥٤ [ الجامع البیان فی تفسیر القرآن]
٥٥ [ السلسلة الصحيحة|الصفحة أو الرقم: 712 | خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح على شرط مسلم | التخريج : أخرجه أحمد (19612) واللفظ له، والطحاوي في ((شرح مشكل الآثار)) (4003) ]

# «مەرجی پێنجەم القبول»

مەرجی پێنجەم بریتیە لە القبول – واتا قبوڵکردن و پێ ڕازی بوون ،. واتا کەسی موسـڵمان ڕازیبێت و ملکەچ بێت بۆ هەموو دینی ئیسـلام وە قبوڵی بێت بە دڵ و زمان و کردار ، وە دژی قبوڵ کردن – ڕەتکردنەوەیە و ڕازی نەبوونە بە دینی الله تعالی ، بۆیە ئەوکەسـەی کە دەڵێت من دەبم بە موسـڵمان و لااله الا الله دەڵێت دەبێت تێکڕای دینی ئیســـلامی قبوڵ بێت بەهەموو بەشـــەکانیەوە ، وە الله تعالی دەفەرموێت :«يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدْخُلُواْ فِي ٱلسِّـلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّـيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ»[56] واتا : ئەی ئەوانەی ئیمان و باوارِتان هێناوە هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر ســـایەی ئیسلامەوە و بە تەواوی پەیڕەوی بکەن و شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بەڕاسـتی ئەو دوژمنی ئاشـکراتانە (هەمیشـە دەیەوێت شـەڕو جەنگ لە نێوان خەڵکیدا بەرپا بکات و لە ئیســـلام دووریان بخاتەوە).» بۆیە دەبێت ئەوکەســـەی کە دەیەوێت موسڵمان بێت یان خۆی بە موسڵمان دەزانێت پێویسـتە هەموو دینی ئیسلامی قبوڵ بێت ، وە بۆیان نیە کە خۆشـیان سـەر پشـک بکەن (واتا بۆیان نیە کە بە ئارەزوی خۆیان بکەن کە ئایە ڕازین بە فەرمانی الله تعالی و رسـول ـــــەکەی ﷺ یاخود نا ) بەڵکو دەبێت گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ وە پێی ڕازین : وەک الله تعالی دەفەرموێت : «وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ

٥٦ [ سورة البقرة:208|تەفسیری ئاسان ]

لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا»[57] واتا : بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێک کە الله و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی الله و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە. »وە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : «ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ»[58] واتا : پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە الله و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی الله دا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە.» بۆیە کەسی موسڵمان دەبێت هەموو دینی الله تعالی قبوڵ بێت و ڕازیبێت پێی وە گوێڕایەڵ بێت بۆ ئەوەی الله تعالی و رسولەکەی ﷺ فەرمانی پێدەکەن بە بە ئەنجام دانی شتێک یان ڕێگری لێدەکەن لە شتێک ،

## «مەرجی شەشەم الإنقیاد»

٥٧ [ سورة الأحزاب:36|تەفسیری ئاسان ]

٥٨ [ سورة البقرة:285|تەفسیری ئاسان ]

وه مەرجی شـەشـەم – الانقیاد - ـــــیە واتا گوێڕایڵ بوون و تەسـلیم بوون و ئەنجامدانی فەرمانەکانی الله تعالی وە وازهێنان لە وشـــتانەی کە الله تعالی ڕێگری لێ کردوە یان پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە دژەکەشی وازلێهێنانو تەرک کردن ـە ، وە جیاوازی لە نێوان القبول الانقیـاد ئەوەیە ، البقول واتا ڕازیبونن – الانقیـاد واتا کار پێکردن و تەســـلیم بوون ، بۆ نمونە ، ولله المثل الأعلی ، باوکێک دەڵێت کوڕم ئەم کۆمپانیایەت پێدەدەم ، ئایە قبوڵتە ؟ کوڕەکەشی دەڵێت بەڵی قبوڵمە، ئەمە قبوڵ بوونە ، وە باوکەکە دەڵێت کوڕم بەمشـێوە و بەو شـێوە بەڕێوەی ببە و ئاوا بکە و ئاوامەکە ، وەکوڕەکەشی بە قســـەی دەکات و تەسمیلی قســـەکەی باوکی دەبێت و لێی لا نادات ، وە ئەمەش الانقیادە ـــــیە ،وە الله تعالی دەفەرموێت : «وَمَن يُسْـلِمْ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِـنٌ فَقَدْ اسْـتَمْسَـكَ بِالعُرْوَةِ الوُثْقَى...»[59] واتا : ئەو کەسـەی ڕوو بکاتە پەروەردگاری و کارەکانی هەمووی بگێڕێتەوە بۆ لای ئەو، لە کاتێکدا ئادەمیزادێکی چاکەخوازە، ئەوە بەڕاســـتی مانای وایە کە دەســـتی بە بە هێزترین کارێکیش هەر بۆ لای الله دەگەڕێتەوە.» جا ئەوکەســـەی کە تەسمیل و فەرمان بەرداری دینی الله تعالی دەبێت ئەوا بەدڵنیایەوە دەسـتی گرتوە بە بِالعُرْوَةِ الوُثْقَى ، وە بِالعُرْوَةِ الوُثْقَى واتا لااله الا الله و ئیسلام ، وە الله تعالی لە ئایەتێکی تردا ئەو کەسانە بە چاکەکار ناو دەبات کە تەسمیلی دینی الله تعالی بوون و بەردەوامن لەسەری ، وەک دەفەرموێت : «وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا»[60] واتا : کێ هەیە ئاینی

٥٩ [ سورة لقمان:22|تەفسیری ئاسان ]

٦٠ [ سورةالنساء:125|تەفسیری ئاسان ]

چاکترە پەســـەندترو جوانتر بێت لەو کەســـەی ڕووی کردۆتە الله و خۆی تەســـلیمی ئەوزاتە کردووەو لەکاتێکدا کارجوان و کار پەســـەندەو شـــوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە الله ئیبراهیمی کردۆتە خۆشـــەویســـتی خۆی ڕێزداری کردووە.» وە الله تعالى لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویێت : «وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ..»[61] واتا : هەوڵ بدەن هەمیشـــە و بەردەوام دڵتان لای الله بێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەســـلیمی ئەوبن،» وە مانای وَأَسْـــلِمُوا لَهُ واتا تەسملی ببن و فەرمان بەرداری ببن ، وە ئەو تەسمیل بونەش دەبێت تاوەک و لەسەری دەمریت بەردەوام بیت ، نابێت دژەکەیت تێدابێت کە تەرک و واز لێهێنانە ، هەر کاتێک وازت لە دین هێناو و تەرکت کرد ئەوە ئەو مەرجەت هەڵوەشێوە و لااله الا الله ـیەکت نوقستان دەبێت و قبوڵکراو نابێت

## «مەرجی حەوەتم المحبة»

مەرجی حەوتەم بریتیە لە المحبة : واتا خۆشـویسـتن ، وە دژەکەشی بریتیە لە البغض : واتا ڕق لێبیونەوە ، بۆیە کەسی موســـڵمان دەبێت الله تعالى و دینەکەی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشـــبوێت ، وەک الله تعالى بۆمان باســـدەکات ســـەربارەت بە ئیمانداران لە بارەی خۆشـــەویســـتان بۆ الله تعالى ، وەک دەفەرمویێت :«وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَــدُّ حُبًّا لِّلّهِ ..»[62] واتا : لەگەڵ

---

٦١ [ سورةالزمر:54|تەفسیری ئاسان ]

٦٢ [ سورة البقرة:165تەفسیری ئاسان ]

ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێك كەس هەیە لەجیاتی ئەوەی الله پەرست بێت، شـــتانی تر دادەتاشـــێت بۆ خۆی و (شـــوێن ڕێنموویيەكانی . الله ناكەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلكەو تووله ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران الله یان خۆش دەویت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر الله یان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناكرێت) ... ،» كەواتا كە ئێمە خۆمان بە موسڵمان دەزانین پێویستە كە زۆر ترین و توندترین خۆشەویستیمان بۆ الله تعالی و دینی و ڕێباز و بەرنامەی الله تعالی بێت ، پاشان بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ كە محمدـی دەست پاك و ئەمینە ﷺ ، پاشـان بۆ بڕوا داران و موسـڵمانان. وە الله تعالی لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت :«يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَـــوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ..» [63] واتا : ئـەی ئـەوانـەی باوەڕتان هێنـاوە، هـەر كـەس لە ئێوە لە ئـاین و بەرنامەكەی وەرگەڕێت و پاشـــگەز ببێتەوە، ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەكات) ئەوە لە ئایندەدا الله كەســـانێک دەهێنێتە كایەوە (ئەوەندە ڕێک و پێک و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئـەوانیش ئـەویان خۆش دەوێت،..» پێوســـتە موســـڵمان الله تعـالی زۆر زۆر خۆش بوێـت ، چونكە هەر ئەوە كە لە نەبوونەوە هێناوییەتیە بوون و دروسـتیكردوە ، وە ڕزقی دەدات وە جێگای بۆ داناوە كە تێدا بژی وە ڕێز و شـــكۆی پێداوە ، پاشـــان هیدایەتی داوە لە ناو هەزارەها ملیونەها كەس ، ولله المثل الأعلی ، كەســـێک كارێک بۆ كەســـێكی تر دەكات ، یان كاتێک یەكێک قەرزارە و لە نارەحەتی دایە ، خاوەن قەرزەكان هاتۆتنە ســـەیری و بەتەمان بیكوژن ،

٦٣ [ سورة المائدة:54|تەفسیری ئاسان ]

بەڵام کەسـێک لەو لاوە دێت و دەڵێت ها ئەمە قەرزەکەیتەی ، ئایە دەبێت ئەوە قەرزارە چەندە دڵخۆش بێت ؟ یان دەبێت چۆن سـوپاسی ئەو کەسـە بکات کە قەرزەکەی بۆ دایەوە و بەهۆیەوە ڕزگاری بوو لەو ناڕحەتیە ، جا ئەی ئینسـان تۆ دیقەت بدە کەسـێک لەو حاڵتە ناخۆشـەوە بۆ گەیشـت بە چ حاڵێکی خۆش دەبێت هەسـتی چۆن بێت لەبەرامبەر ئەم مرۆڤە ؟ مەگەر الله خۆی بزانێت ، کەچی ئێمەی موسـڵمان کاتێک کە نەخۆش دەکەوین الله شـیفامان بۆ دەنێرێت ، کاتێک برسـین و تینوین الله نان و ئاومان پێدەبەخشـێت ، وە هەر ئەویشـە کە هەموو شـتیکی بۆ بەرهەم هێناوین ، وە تەنانەت گەر تاقیشـی کردینەوە بە شـتێک کە قورس و ناڕحەت بوو لەسـەرمان ئەوا هەر نیعمەتت و بەخشـشـی خۆیەتی ، چونکە ئەو دەزانێت خێری ئێمە لە چیدایە و چی بۆ ئێمە باشە وەک دەفەرموێت : «وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـًٔا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـًٔا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ»[64] واتا : بەڵام لەوانەیە شـتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شـتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شـەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر الله خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن. »بۆیە پێویسـتە کە ئێمە زۆر ترین خۆشـەویسـتیمان بۆ الله تعالی هەبێت ،

## «مەرجی هەشتەم الكفر بما يعبد من دون الله»

٦٤ [ سورة البقرة:216|تەفسیری ئاسان ]

وە کوتا مەرج بریتیە لە الكفر بما يعبد من دون الله ، واتا بێ باوڕبیت بەوەی کە لە غەیری الله دەپرسـترێت ، وە دژەکەشی باوڕبونە پێی ، وە ئەم مەرجە لە پێوسـتەکانی کوفر کردن بە تاغوت ـــــیش دا هەیە، یاخو بڵێن لە پێویسـتەکانی نەفیکردنی پرسـتراوە باطڵەکانە وەک لە پێشـوو لەباسی چۆنیەتی نەفیکردنی پەرسـتراوە باطڵەکان باسـمان کرد کە خاڵی چوارەم بوو ، واتا ئەم خاڵە لە پێویستەکانی ئەسڵی دیندا هەیە وە لە مەرجەکانی لااله الاالله ـــــیە ، بەڵگەمان لە پێشـوو باسـکرد کە لە پێویسـتەکانی ئەسـڵی دینە، وە بەڵگەش بۆ ئەوەی لە مەرجەکانی لااله الاالله ـییە ، لە فەرمودەی طارق بن أشيم رضي الله دا هاتوە ، عَنْ النبي – صـلى الله عليه وسـلم – إنه قال: «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّه، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللّه، حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ. وَحِسَـــابُهُ عَلَى اللّه»[65] واتا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەرکەسێک بڵێت هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالى نەبێت ، وە بێ باوڕبێت بەوەی لە غەیری الله تعالى دەپەرســـترێت ، ئەوا ماڵ و خوێنی حەڕام دەبێت لەسەر موسڵمانان ، وە حساب و لێپرسینەوەی لەسەر الله تعالى ـــــیە » وە ئەمەش بەوە دەبێتە بەڵگە کە دیقەت بدەیت پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەکەی دا يكفر بما يعبد من دون الله ـــــی لەدوای لااله الا الله فەرمووە ، وە جیای کردۆتەوە ، هاوشـــێوەی فەرمودەکانی تر کە لەباسی مەرجەکانی تردا هێنامان و باسمان کرد ، بە سوپاسکردنی الله تعالى وە لە کۆتایدا دەڵێن ئەوەی باسکرا ئەوە ماف و پێویستیەکانی لااله الا الله ـــیە کە تێکڕەی پێغەمبەران بۆ بانگەشە کردنی خەڵکی بۆی نێردراون ،وە لە پێناوی دا ئاسمانەکان و زەوی دروستکراون و بۆتە هۆی جیاکردنەوەی

---

٦٥ [ رواه: مسلم ]

خەڵکی بۆ دوو بەش و جۆڕ ، یەکیان بەری کوفر  الله پەنامان بدات لیی وە یەکیان بەرەی ئیمان  الله لەسـەری زیندوومان بکاتەوە وە ئەمە ئەو لااله الا الله ـــــیە کە گەر کەســێک بەم جورە وتی پاشــان لەســەری مرد دەچێتە بەهەشــتەوە ، وە تێکڕای فەرموودەکانی تریش کە باسی لااله الا الله دەکات ، باسی ئەم جورە لااله الا الله ـــــیە دەکات ، نەک ئەوەی دەروێشەکان لە شەوانی تارێک دەیڵێن و ئەو مەلایانەی کە پارەی پێورەدەگرن ، پەنا بە الله  ، وە داواکارین لە  الله تعـالی کە لە پێنـاو خۆی و لیمان قبوڵبکات و لەسەری بمان ژیێنێت و لەسەری بمان مرێنێت و لەسەری زیندومان بکاتەوە ، هەرکەسـێک خاوەنی ئەم لااله الا الله بێت ئەوا خاوەنی کلیلی دەرگای بەهەشـتە. وە بزانە و وریابە کلیلەکەت لە ڕێگا لێ بزر نەبێت و ونی نەکەیت  چونکە قیامەت وەک دونیا نیە کە بگەرێنەوە بۆ گەڕان بە دوایدا . لەچاوەکانت زیاتر بپارێزە و وریاری بە چونکە سوێند بە  الله کەسی بڕواداری نابینا دەچێتە بەهەشتەوە بەڵام کەسی بێ باڕوی چاو ســاغ  ناچێتە بەهەشــتەوە ،بۆیە لە چاوەکانت زیاتر وریابە و بیپارێزە ، وە چۆن چاوەکانت لە کاتی هەڵکردنی بایکی بەهێز لە وردە برد و خۆڵەکان دەپارێزیت، تەشــبیهـ نەبێت ئاواش لااله الا الله ـیەکەت بپارێزە لە بچوکترین شت ، داواکارم لە  الله تعالی لە پێناو ناوە جوانەکان و سـیفاتە بەرزەکانی خۆی لااله الا الله مان لێ قبوڵبکات بۆ خاتری اسم الأعظم ی آمین.

لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن

سُبْحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ  وَسَلَـٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ

---